# (جوانی)

گرنگی بە ، خۆم ، دەدەم
مروڤێکم ، تێدەگەم

دەست وسەری خۆم ، دە شۆم
بە ، جوانی خواردن ، دەخۆم

قژی خۆم ، دادەهێنم
نینۆکم ، دەقرتێنم

بەرگی ڕێک ، لە بەر دەکەم
بۆنی خۆش ، لە ، خۆم ، دەدەم

لە ، ڕێگە و بان و کۆڵان
ڕێک..ڕێک.. دەڕۆم ، زۆر ، جوان

گفـــت ، شـــیرینی دەنـــوێنم
ئـــەرکی خـــۆم ، بـــەجێ دێـــنم

ڕەوشـــــتم ، دەپـــــارێزم
بـــە ، بـــڕوا و خـــووی بـــەهێزم

کەواتـــــە ، واتـــــای جـــوانی
شـــــارەزایی و شـــــایانی

بـــــە ، ڕاســـــتی موســـــلمانە
گوتـــــە و کـــــردەوەی جوانـــــە

نووسینی/سێ شەم/٢٦/ربیع الاول/١٤٢٤.ك
٢٠٠٣/٥/٢٧ل

تێبینی/١) دێڕی (٨)(٩)ی بلاّونەکراوە تەوە
٢) لـــــەژمارە (٤٨٥)ی ڕۆژنامـــــەی (یـــــەکگرتوو) بلاّوکرایتەوە.

## (هاوولاتی)

هـــــــاوولاتی موســــــلمانم
بەنـــــــدەی (خــــــوداى میهرەبـــــانم)

دیـــــــن و ڕێـــــــازم ، ئیـــــــسلامە
موحەمـــــــەدیش(ﷺ) پێـــــــشەوامە

کــــــوردێکی شـــــاری هــــــەولێرم
پـــــاك و چـــــەلەنگ و بـــــوێرم

نیـــــــشتیمانم ، کوردســــــتانە
خـــــۆش و دڵگــــــیر و جوانــــــە

خـــــاوەن ، پــــەروەردەی قەشـــەنگم
بـــۆ ، کـــاری چـــاکە ، پێـــشەنگم

دەمـــــەویٚ ، هــــەموو ، منـــــدالاٚن
هـــــاوەلٚ و هـــــاوڕیٚ و هـــــەڤالاٚن

پـــاك و چـــاك و گفـــت شـــیرین ، بـــن
پابەنـــــدی دەســـــتووری(دیـــــن)بـــــن

نووسینی/دووشەم/١٨/ربیع الاول/١٤٢٤.ك
١٩/٥/٢٠٠٣ل

تێبینی/لەژمار(١١٨)یڕۆژنامەی(کۆمەلٚ) بلاٚوکراوەتەوە

## (پێشوازی)

پێشوازی یە ، پێشوازی
رێك و بێ جیاوازی

دڵی خەلك ، خۆش ، دەكات
بەرەو چاكەی هان دەدات

كاتێ ، ئەتۆ ، مێوانی
بە ، گەرم و گورو جوانی

كە ، پێشوازیت ، لێدەكرێ
خانەخوێ ، رێزت ، دەگرێ

چەندە ، دڵت ، پێ ی شادە
بەو ، كارەی ئادەمزادە

كەواتە ، تۆش ، بەم ، شێوە
رێك بەوپابەندبە ، پێوە(١)

چـــونكه ، پێـــشوازی ، گـــەرم
بـــە ، گفـــتی خـــۆش و نـــەرم

چـــاكه و خێـــرت ، پـــێ دەگـــات
ڕێزداریـــــت ، نیـــــشان ، دەدات

بـــەڵێ ، هەســـته ، تێكۆشـــە
بـــەو ، كـــارە ، باشـــە و خۆشـــە

پێـــشوازی جـــوان ، پیـــشان دە(٢)
خـــەلك وخزمانـــت ، هـــان دە(٣)

نووسینی/پێنجشەم/٤/جمادی الاولی/١٤٢٤.ك
٢٠٠٣/٧/٣ل
تێبینی/لەژمارە(١٠١-١٠٢)گوڤاری جگەرگۆشەكان بلاْوكراوەتەوە.

فەرەنگۆك:
(١)پێوە:پێیەوە ، پێ ی
(٢)پیشان دە : پیشان بدە
(٣)هان دە:هان بدە

## (کیژی قشتم)

کیژی من ، گەلەك ، قشتە
حەزی لە ، گەمە و چشتە

ناوی خۆشە و(نوهایە)
نیعمەتێکی خودایە

ژیکەڵە و توند و تۆڵە
دەکۆشێ ، بۆ ، گاگۆڵە

لە ، تافی گڕوگاڵە
خۆشەویستەکەی ماڵە

دەم ، بۆ ، چشتان ، دەباتن
چەنگی لێگیر ، دەکاتن

## هاوڕێیانم

بـــــۆ ، دایکـــــی زۆر ، پەرۆشـــــە
یـــاری و خەنـــدەی زۆر ، خۆشـــە

(کـــاکی) و (خوچـــە)ی جـــوانن
(عەبـــدوڵڵا) و (هـــودا)خـــانن

حـــەز ، بـــە ، گـــەمانیان ، دەکـــات
جـــار ، جـــار لێیـــان ، ڕادەکـــات

گـــەمانی خۆشـــە و جوانـــە
کـــچی مـــن ، خـــان ومانـــە

ئـــا ، کیـــژی خـــۆم ، خۆشـــدەوێ
چاکەوخۆشـــیم ، بـــۆی ئـــەوێ

دەخـــوازم ، مایـــەی خێـــر ، بـــێ
لـــە ، ژیـــانی دلێـــر ، بـــێ

نووســـینی/شـــەوی هـــەینی/٣٠ـــ١/ذي القعـــدة ـ
ذيالحجة/١٤٢٤.ك
٢٢ـ٢٣/١/٢٠٠٤ل

تـێ بـی نـی/ لـەژمارە(٥٤) ی گۆڤـاری – نوالـّەی نـوێ –
بلاّوكرایتەوە

## ( پشووی هاوین )

ئـــــەم ، ســـــاڵەش ، قوتابخانـــــە
بـــــە ، ئامۆژگـــــاری و وانـــــە

دیـــــسان ، کۆتـــــایی پێهـــــات
وەرزێکـــــی تـــــازە ، هـــــەڵهات

هاوینـــــــەو وا ، پـــــــشووە
ئـــــەو ، کەســـــە ، ســـــەرکەوتووە

کـــــە ، لـــــە ، دەرفـــــەتی هـــــاوین
بـــــە ، ئەوپـــــەڕی توانـــــا و تـــــین

کـــــاتی ، بـــــە ، فێـــــڕۆ ، نـــــادات
بـــــە ، ڕێکـــــی هـــــەوڵ ، دەدات

گوێڕایـــــــەڵی دەنــــــوێنیٚ
زانــــــستەکان ، دەخـــــوێنیٚ

دەزانێـــــــت ، کــــــە ، پــــشووە
پێویـــــستە و پێویـــــست بـــووە

نووسینی/٢٤/ربیع الپانی/١٤٢٥.ك
٢٠٠٤/٦/١٢ل

تێبینی/لەژمارە(٤٩٦)ی(یەکگرتوو)بڵاوکرایتەوە

# (میللەتی کورد)

بـــــزانن ، ئـــــەی منـــــدالأن
ئێمـــــەش ، هـــــەر ، وەکوگـــــەلان

زۆر ، مـــــاف وحـــــەقمان ، هەیـــــە
مێـــــژووی خۆمـــــان ، بەڵگەیـــــە

خـــــاوەنی زێـــــدوخاکین
تێکۆشـــــەری چـــــالاکین

خاکمـــــان ، داگـــــیر ، کـــــراوە
زۆرداریـــــان ، لێکـــــراوە

ئـــــادەمزادین ، لـــــەم زەمـــــین
زەوی(رب العـــــالمین)

خـــــاوەن ، جێگــــــە وولاّتـــــین
گـــــــەلێکی ڕۆژهــــــــەلاّتین

بـــــەلێ ، میللــــــەتی کـــــوردە
پـــــــڕ ، ڕووداوە و ســـــــەربووردە

قـــــــــەومێکی موســـــــــلمانە
ولاّتــــــــــی کوردســـــــــتانە

نووسینی/سێ شەم ، چوارشەم/٢٤ ، ٢٥/محرم/١٤٢٥.ك
١٦ ، ٢٠٠٤/٣/١٧ل

# (کۆرپە جوانەکەم)

کــــورم ، (عەبـــــد وڕڕە حمانـــــە)
نــــاوی خـــــۆش و جوانـــــە

لای(خــــوا) خۆشـــترین ، نـــاوە
نـــــاوێکی خـــــۆش وبـــــاوە

کۆرپـــــەکی ســـــپی وســـــۆڵە
بـــــە جوولـــــە و توندوتۆڵـــــە

بـــــە ، چـــــەپڵە لێـــــدان ، قـــــشتە
حـــــــەزی لەشیروچـــــــشتە

بابـــــە بابـــــەم ، پـــــێ دەڵێـــــت
بـــە ، گـــاگۆرە ، بـــۆ ، لام ، دێـــت

دەست ، لــە ، بۆ ، بـن ، گـویٚ ی دەبات
ئـــا..ئـــا و تەلـــەفۆن ، دەکـــات

ـــه ، برسـی بـوون ، دەگریـی
شـتم ، لـه ، دەسـت ، وەردەگـریّ

چـەند بلّـێی ئێـسك سـووكە
متـووی ئـەلوو پەڕتووكـه

كـنـه ، كـاتیّ ، تـووڕە ، دەبـیّ
لـه ، سـەر ، عـارد ، دەنـویّ و دەخـشیّ

جـا ، مـن ، وەك ، بـاب ، خۆشـحالّم
بـه ، كـوڕی جـوانی مـالّم

داوا ، دەكـەم ، لـە(خـودا)
بـه ؛ هەشـتی شـاد ، بكـا

نووسینی/شەوی یەكشەم/١٦/ ١٧/شعبان/١٤٢٧.ك
٩/١٠/٩/٢٠٠٦ل
تیّ بی نی/ لـەژمارە (٥٤) ی گۆڤاری جگـەر گۆشـەكان
– بلاوكرایتەوە.

## (پەروەردە)

منداڵی کوردی ئازامە
دین و ئایینم ، ئیسلامە

ژیر وخاوێن وچاپووکم
هۆگرومتووی پەڕتووکم

منداڵانم ، گشت ، خۆشدەوێن
چاکەوخۆشیم ، بۆیان ، دەوێن

بە ، ڕەوشت ولەسەرەخۆم
کە ، نانم ، خوارد ، زێتر ، ناخۆم

لە ، قوتابخانە ، هەڵناهێم
بەوتەووشەی باش ، دەدوێم

بـــەڵێ ، منـــدالآن ، ئـــەم ، خـــووە
مـــالێ ، پـــەرەوەردەی مـــن ، بـــووە

ئێـــوەش ، ئـــازابن ، گـــوێ بگـــرن
ئـــەم ، ئاكـــاروخووە ، وەرگـــرن

نووسینی/دووشەم/٦/رەمەزان/١٤٢٣.ك
٢٠٠٢/١١/١١ل
سێشەم/١٢/زیالقدە/١٤٢٣.ك
٢٠٠٣/١/١٤ل
تـــێ بـــی نـــی/ لـــەژمارە (٢٢)گۆڤـــاری گوڵـــەكان –
بلاوكرایتەوە

## (پیرۆزبایی)

پیرۆزبایی ، لە ، یەکدی
گونجاو باش ورەندی

بەو ، شێوەیە ، تەواوە
کە ، ئیسلام ، ڕێ ی پێداوە

ئەوجا ، گەلی منداڵان
خۆشەویستانی ماڵان

دەبێ ، باش ، گوێڕایەڵ ، بن
ئاگادار و زیتەڵ ، بن

بزانن ، باش ، تێبگەن
پیرۆزی لە ، کێ ، دەکەن؟

بـــــەڵێ ، واتـــــای پـــــیرۆزی
نرخەوڕێزەودەستخۆشـــــــــــــــی

کەواتـــــە ، کـــــێ ، شـــــایانە؟
بـــــەو ، نرخـــــەوڕێزە ، جوانـــــە

ئـــــەو ، کەســـــەی چـــــاکەکارە
هـــــەر ، بەنـــــدەی پـــــەروەردگارە

نووسینی/پێنج شەم/٨/صەفەر/١٤٢٤.ك
١٠/٤/٢٠٠٣ل
پێنج شەم/٧/ربیع الاول/١٤٢٤.ك
٨/٥/٢٠٠٣ل

## (شەرم)

شـــەرم ، بەشـــێکە ، لـــە ، (ئیمـــان)
ڕەوشـــتێکە ، بـــۆ ، موســـلمان

موســـلمان ، پێـــوەی پابەنـــدە
پابەنـــدی بـــۆ ، (خوداوەنـــدە)

(خوداوەنـــدیش)چـــۆنی بـــوێ
موســـلمانیش ، ئـــەوها ، دەلـــوێ

شـــەرم ، واتاکـــەی(حەیایـــە)
وشـــەی ، قەشـــەنگی دونیایـــە

بـــەڵام ، منـــداڵانی شـــیرین
گوتـــەی (لاحـــەیا ئـــە فیـــددین)

لـــه ، بـــۆ ، فێربـــوون ، هانتـــان ، دەدات
فێـــره ، ڕێـــسای جوانتـــان ، دەكـــات

پێتـــان ، دەڵـــێ ، شـــەرم ، مەكـــەن
چـــی ، نـــازانن ، پرســـیار ، بكـــەن؟

واتـــه ، شـــەرم ، بـــاش ورەنـــده
موســـلمان ، پێـــوەی پابەنـــده

منـــیش ، دەڵـــێم ، بـــژی شـــەرم
بـــۆ ، پـــەیڕەوی كۆڵنـــەدەرم

نووسینی/چوارشەم/٢٣/محرم/١٤٢٤.ك
٢٠٠٣/٣/٢٦ل
یەكشەم/١٨/رجب/١٤٢٤.ك
٢٠٠٣/٩/١٤ل

# (دیمه نی مندالٚ)

چەپە..چەپە..چەپانە
بەو ، دەستوبەولەپانە

چئا..چئاو ، حەم ، حەمە
بڤەبڤەوەم ، مەمە

گاگۆلەوخش خشینە
دیمەنێکی نەخشینە

گریەو زریقانەوە
وەستان وجوولانەوە

باب ، بابەودادا ، دادە
چەندە ، خۆشی یەوشادە

لــــەم دەســـت ولـــەو ، دەســـتانە
بەربوونـــــەوە وهەســــــتانە

شــــــەقاو ، شـــــــەقاووتاتی
کۆرپەیەوبـــــــــــەخێرهاتی

ئـــــەو ، قۆناغـــــەی تەمەنـــــە
جـــــــوانترین ، دیمەنــــــە

ئــــــا ، دیمـــــەنی منــــــدالّن
دایـــك وبـــاب ، پـــیّ ی خۆشـــحالّن

ئـــــەو ، دیمەنـــــەش ، دیـــــارە
نیعمـــــــەتی پـــــــەروەردگارە

نوسینی
/چوارشەم/٧/سەفەر/١٤٢٤ك
٩/٤/٢٠٠٣ل

## (گۆڕانکاری)

گۆڕانکاری ، وا ، باشه
به ، دەروون بێ و به ، لاشه

له ، خراپه ، بۆ ، چاکه
دەست پێ کەن ، خوشك و کاکه

له ، پیسی بۆ ، پاکژی
بۆ ، پاکی بڵێن ، بژی

دڕدۆنگ ، مەبن ، ڕووخۆش ، بن
بۆ ، باشه ، به ، پەرۆش ، بن

تەمبەڵ ، مەبن ، زیتەڵ ، بن
هۆشیار و گوێڕیەڵ ، بن

نــــەزان ، مـــــەبن ، زانــــــا ، بــــن
لــــە ، وتـــە و کــــار ، دانــــا ، بــــن

بـــــەم ، جــــۆرە ، گۆڕانکـــــاری
واتـــــــە ، چـــــاکە و بێـــــداری

دەی منـــــــدالآن ، بنـــــــۆڕن
بـــۆ ، باشــــە ، خـــۆ ، بگــــۆڕن

دووشەم
نووسینی / ٥ ، ١٥ / صەفەر / ١٤٢٤ ك
پێنجشەم
٧ ، ١٧ / ٤ / ٢٠٠٣ز

## (پا ریزگاری)

مندالآن ، پاریزگاری یه
هێما و سیمای بێداری یه

پاریزگاری له ، چی ، چاکه ؟
پیویست و گونجاو و پاکه

بەلێ ، وەرن ، با ، تێ بگەین
پاریزگاری لێکتر ، بکەین

راسپاردەی یەك ، بپارێزین
ئەگەر ، دەستپاك و بەرێزین

لەگەڵ ، یەكدی ، دلمان ، پاك ، بێ
وتە و كردەوەمان ، چاك ، بێ

# هاوڕێیانم

خۆشـــیمان ، بـــۆ ، یـــەکتر ، بوێـــت
یـــەکترمان ، بـــۆ(خـــوا)خۆشـــبوێت

لـــە ، کـــاتی پێویـــست ، هانـــا ، بـــین
کـــار ، ڕێـــك وزاناودانـــا ، بـــین

کەواتـــــە ، پارێزگـــاری یـــــە
دژی گـــشت ، پێـــشێلکاری یـــە

بـــژی ئـــــەوەی پارێزگـــــارە
گوێڕایـــــــەڵی(پـــــەروەردگارە)

نووســـــــینی/چوارشـــــەممە ، پێنجەممـــــــە/٢١ ،
٢٢/صەفەر/١٤٢٤.ك
٢٣ ، ٢٠٠٣/٤/٢٤ل

## (ڕێگــــه)

گوێڕایـــــەڵی بابـــــە و دایـــــە
فــــەرمانی پــــیرۆزی(خوایــــە)

ئــــەوەی کــــار ، دەکــــا وڕەنجــــدەرە
پــــەیڕەوکاری پێغــــە مبــــەرە (ﷺ)

ڕاســـتگۆیی و باشـــی و پـــە یمانــــە
هێمــــا و بەڵگـــەی موســــڵمانە

بـــــاوەڕو چـــــاکە و ئارامــــە
ڕێبــــــازی پــــاکی ئیــــسلامە

بــــەڵێ ، ئەمــــە ، ڕێگــــە و دینــــە
پــــەیڕەوی ، کــــەن ، منداڵینــــە

نووسینی / دووشەم / ١١ / ربيع الاول/ ١٤٢٤ ك
١٢ / ٥ / ٢٠٠٣ز

## (بەندایەتی)

ڕاســــــتەقینەی بەندایـــــــەتی
واتـــــە ، یـــــەعنی ، مەردایـــەتی

بەندایـــــــەتیش ، جۆرەهایــــــــە
ئـــــەوهابووەو ئــــا..ئەوهایـــــە

بـــــەڵام ، ئـــەوەی پوخـــت وپاکـــە
بـــۆ ، دونیـــاو قیامـــەت ، چـــاکە

بەندایـــــەتی ، بـــــۆ(خودایـــــە)
ڕاســـــــتی وڕەوایەوڕەهایـــــــە

مایــــــەی قـــــازانجی ئینـــــسانە
کامـــــــەرانبوونی ژیانـــــــــە

لەبەرهەنـــــــدیّ ، بەندایــــــــەتی
پێویـــــــــسته ، مرۆڤایــــــــەتی

تـــەنها ، بەنـــدەی(خوداوەنـــد)بـــن
پابەنـــدی ڕیّ ی ڕاســـت(١)وڕەنـــد ، بـــن

نووسینی/پێنجشەم/٢٨/ربیع الاول/١٤٢٤.ك
٢٠٠٣/٥/٢٩ل

فەرهەنگۆك:
ڕیّ ی ڕاست:ڕیّ ی خودا ، ئاییی ئیسلام

## ( بەزەیی )

بـــــەزەیی ، ڕەحمـــــە ، ســــۆزە
کـــــێ ، پـــەیڕەوکات ، دڵــــسۆزە ؟

ڕێکــــــی و دڵخۆشـــــی ژینــــــە
پـــــەخش بـــــوونی ئەوینـــــە

پـــــە یرەوکــــــاری ڕێـــــزدارە
خــــــاوە ن ، ســــیمای ئاکـــــارە

بــــــەهاو تـــــــەبایی خەلکـــــــە
گـــــەلێ ، چـــــاکەوبە ، کەلکـــــە

کەواتــــــە ، پێویـــــستی یـــــە
مایــــــەی خۆشەویـــــستی یـــــە

لەگــەڵ ، یــەك ، بــە ، ڕەحــم ، بـین
بــــە ، پێـــــی ڕێنمـــــایی (دیـــــن)

چــــونکه ، فـــــەرمووده ، هەیــــە
کــــە ، قــــازانجی ، بــــۆ ، مەیــــە

فــــەرموون ، بلّــــێین: لەیــــسەميننا..)(١)
(مــــەن لــــەم یــــەرحم صــــەغیرەنا)

نووســــــینی/پێنجــــــشەم/سێــــــشەممە/١١ ،
١٦/جمادالاول/١٤٢٤.ك
١٠ ، ١٥ /٧/٢٠٠٣.ل

فەرهەنگۆك
(١)ئاماژەیەبەفەرموودەی
((لیس منا منّ لّم يرحّم صّغيرنا))
بــەلاّم لەشــعرەکەدا بەڕێنووســی کــوردی نووســراوە تــاکو
مندالّ بزانێ بیخوێنێتەوە
تــێ بــی نــی/ لــەژمارە (٤١)ی گۆڤــاری – خەنــدە-
بلاّوکرایتەوە

# (میوەجات)

منـــــــدالأن ، گردبنـــــــــە وە
بنـــــــــۆڕن ، وردبنـــــــــــەوە

حـــە زتـــان ، لـــە ، كـــام ، مێوەیـــە؟
گـــــــەڵێك ، دڵتـــــــان ، پێوەیـــــــە

ئـــــەم ، هـــــــەموو ، مێوەجاتـــــــە
لیمۆوســـــــــــــــــــێووكەباتە

شـــــیرین وتـــــرش ومێخـــــۆش
هــە موویـــان ، زۆر ، خۆشـــن ، خـــۆش

بــــۆ ، نموونـــــــە ، هـــــــەنارە
ســـــێ ، تـــــامی لـــــێ دیـــــارە

بەڕاســــتی چـــــەندی بێـــــژن
خۆشـــــی وتـــــامی بـــــچێژن

لـــــەو ، مێـــــوەی لـــــەپێش چـــــاوە
کـــــە ، دەیخـــــۆن ، نـــــاوە..نـــــاوە

نـــــاتوانن ، شـــــرۆڤەی(١)کـــــەن
واتاومـــــانی خـــــۆی پـــــێ دەن

بـــــەڵکو ، ئەگـــــەر ، زیتـــــەڵن
منـــــــدالی گوێڕایـــــــەڵن

ئـــــا..ئـــــەم ، هـــــەموفیقی(٢)یـــــە
کـــــە ، بـــــۆ ، مـــــرۆڤ ، خۆشـــــی یـــــە

## نیعمەتی(پەروەردگارن) کوانێ ، سوپاسگوزارن؟

نووسینی/هەینی/٢٧/ربیع الاول/١٤٢٤.ك

٢٠٠٣/٦/٢٧ل

فەرهنگۆك:

(١)شرۆڤەی کەن: لێکی بدەنەوە ، وەسفی بکەن ، باسی بکەن

(١)فیقی:میوە

تێ بی نی/ لەژمارە (١٣٢) ی گۆڤاری (هەنگ) بڵاوکرایەوە

## (حەرام وحەلال)

نـــــەوەی تـــــازە ، زۆر ، پێویـــــستە
بـــــۆ ، ژیـــــانی پێداویـــــستە

گـــــەلێك ، شارەزاوهۆشـــــیار ، بـــــێ
لـــــە ، دینـــــی خـــــۆی ئاگـــــادار ، بـــــێ

تـــــاكو ، بـــــە ، ئاكـــــاری جـــــوان
بـــــە ، هـــــەلس وكـــــەوتی لـــــە ، ژیـــــان

بـــــە ، خۆشەویـــــستی ودەســـــتپاكی
ببێتـــــە ، نیـــــشانەی پـــــاكی

نزیـــــك ، زۆرداری ، نەكـــــەوێ
شـــــتێك ، جـــــێ ی شـــــك ، بـــــێ ، نەیـــــەوێ

بیـــــسەلمێنێ ، كـــــە ، مرۆڤـــــە(١)
كـــــاری ببێتـــــە ، شـــــرۆڤە

(حـــەرام)و(حـــەلال)لێـــك ، كـــاتۆ(٢)
وتـــەوكردەوەی تێـــك ، كـــاتۆ(٣)

بـــەڵێ ، ڕاســـتی ، ئەوهالـەیـــە(٤)
خۆشـــی ئـــا ، لـــەم ، حەلالـەیـــە

جـــا ، پێویـــستە ، هـــەموو ، منـــداڵ
بزانـــێ ، (حـــەرام) و (حـــەلال)

نووســـینی / دووشـــەم ، چوارشـــەم / ٨ ، ١٠ / جمـــا
دالاول/ ١٤٢٤ ك
٧ ، ٩ / ٧ / ٢٠٠٣ل

<u>فەرهەنگۆك :.</u>

(١) شرۆڤە : شیکرنەوە
(٢) لێك كاتۆ : لێك بكاتەوە
(٣) تێك كاتۆ: تێك بكاتەوە
(٤) ئەوهالـەیە : ئاوایە ، وایە ، هۆسایە .

# (کیژی ڕۆشنبیر)

کیــــژی ڕۆشـــــنبیر ، کــــێ یـــه ؟
ڕەوشـــــتی چـــاکی پـــێ یـــــه

لـــه ، کـــام ، شـــوێن و جێگایـــه؟
جــــێ ی شـــانازی دونیایـــــه

لـــه ، کـــوێ ، پـــەروەردە ، بـــووە ؟
لــــه ، نێـــو ، خێزانـــی خـــووە

بۆچـــــی ، ڕێـــــك و ئارامـــــه ؟
پـــــەیڕەوکاری ئیـــــــسلامه

چـــەند ، بـــۆ ، دینـــی پەرۆشـــه ؟
دڵـــــسۆز و بـــــالاّ پۆشـــــه

هاوڕێیانم

چــــۆن و کــــوو ، وا ، پابەنــــدە ؟
هیدایــــــەتی (خواوەنــــــدە )

دەوجــــــا ، وەرن ، کــــــچۆڵان
ناســـــك و نـــــەرم و نـــــۆڵان

تێکۆشــــــن ، ڕۆشـــــنبیر ، بـــــن
زانــــا و عاقــــڵ و ژیــــر ، بـــــن

نووسینی / هەینی / ١٢ / جمادالاول / ١٤٢٤ ك
١١ / ٧ / ٢ / ٢٠٠٣ز

## (ئایینی خۆت بناسە)

ئـــــــاييني خـــــۆت ، بناســــــه
بـــێ گومـــــان ، پـــاك و ڕاســــه (١)

تــــــەنها ، دينـــــــه ، ڕەوايـــــــه
(خـــوای تـــەنها) پـــێ ی ڕەزايـــــه

ئاشـــــــتی وئـــــــازادی خەڵكـــــــه
بـــۆ ، بوونـــەوە ر ، بـــــه ، كەڵكـــه

ڕێـــــــی ژيــــــانی ئينــــــسانه
ئاسايــــــــــــشی جيهانــــــــــــه

خێـــزان ، ڕێـــك وپێـــك ، دەخـــات
بــــــەرەو ، بڵنــــــدی دەبــــــات

هاوڕێیانم

کــــار و دڵـــــسۆزی ئــــەوێت
تــــەقواداری خـــۆش د ەوێـــــت

ئــــەوجا ، دەزانـــــی ، منـــــداڵ ؟
جگـــە رگۆشــــە کــەی نێــو ، مــاڵ

ئــــەم ، ئایینــــــە ، کامەیــــــە ؟
کـــــە ، دوا ، دیـــن و نامــــە یــــە

نوســینی/ دووشــەممە ، ســێ شــەممە /١٥ ، ٢٣/جمــاد الاول /١٤٢٤.ك

١٤ ، ٢٢/٧/ ٢٠٠٣ل

تێبینی/لە ژمارە (٣١) ی ـ دەنگی غە ریبان ـ بلاّوکرایتەوە

فە رهەنگۆك/

١)راسە : راستە ، تەواوە

٢) تە قوادار :پارێزکار ، سنوورەکانی خوا بپارێزێ

# (کاتی گونجاو)

کــــاتی گونجــــاو ، هەڵبــــژێرە
دەســــت پــــێ بکــــەو دەی بــــوێرە

کــــاتی ســــەردانی مێــــوانی
هــــەنگاو بنــــێ ، زۆر ، بــــە ، جــــوانی

کاتێــــك ، پرســــیارێکت ، هــــەبوو
لــــە ، کــــاتی گونجــــاو ، بیفــــەرموو

ئــــەو ، کاتانــــەی نــــەگونجاون
جــــێ ی وەڕســــی ونەویــــستراون

بــــەیانی ، زوو ، چــــەقەی نیــــوڕۆ
نیــــوەی شــــەوێ ، مەچــــوو ، مــــە ڕۆ

بـــەڵێ ، ئـــەو ، کاتـــەی گونجـــاوە
بـــە ، ئـــادابی خـــۆی تـــەواو ە

دە ســـــا ، ئێـــوە ش ، منداڵـــــەکان
کـــــورِ وکـــــچانی ماڵـــــــەکان

ئـــەو ، کاتـــــە ، ڕێـــك و دلێـــرن
کـــاتی گونجـــاو ، هەڵدەبـــژێرن

نووســـــینی / دووشـــــەم ، ســـــێ شـــــەم / ١٥ ، ١٦ /
جمادی‌الاولی / ١٤٢٤ ك
/ ١٤ ، ١٥ / ٧ / ٢٠٠٣ ل
تێبینـی / لـە ژمـارە (١١١)ی گۆڤـاری ـ جگەرگۆشـەکان ـ
بڵاوکرایتەوە

فەرهەنگۆك : (١) نیورۆ ، نیڕۆ ، نیوەڕۆ ، نیوڕان

## (مافی مرۆڤ)

منـــــدالآن ، پێتــــان ، دەڵــــێم
گوناحــــــه ، پێتــــان ، نـــــەڵێم

مــــــرۆڤ ، خـــاوەنی مافـــــه
گــشت ، ڕەنــگ وگــشت ، قیافــه(١)

(خـــــودا)ڕێـــــزی لێنـــــاوە
مـــافی لــــه ، بـــۆ ، دانـــاوە

مـــافی مـــــرۆڤ ، لـــــەم ، ژینـــه
گـــەر ، تێبگـــەین ، لـــه ، دینـــه

مـــافی ئـــــازادی وتێربـــــوون
بــــه ، پەروەردەوبـــــه ، فێربـــوون

مـــــرۆڤ ، پێویـــــستی پێـــــیتی
حـــەق ومافـــه ، لـــه ، جێـــیتی

بـــەڵام ، ئـــەوەی جـــێ ی داخـــە
پـــڕ ، ئـــۆف وئـــێش وئاخـــە

مافـــەکان ، پێـــشێل ، دەکـــرێن
هەوڵـــەکان ، لـــەبار ، دەبـــرێن

بـــۆ ، بەڵگـــە ، کـــوا ، بـــۆ ، کـــوردان ؟
مـــاف و چـــارەی کوردســـتان

کـــە واتـــە ، پێویـــستە ، گـــشت
بـــە ، تەقـــەڵای(١) پوخـــت و ڕشـــت

پـــشت بـــە (خـــوا) بـــسەلمێنین
مافـــەکان ، بـــەجێ بێـــنین

نووسینی / شەموو ، یەکشەم / ١٤ ، ١٥ / محرم / ١٤٢٥ ك
/ ٦ / ٧ /٣/ ٢٠٠٤ل

فەرهەنگۆك:
(١)قیافە : بەژن ، بالاّ ، بارا
(٢)تەقەلاّ : هەوڵ : تێكۆشان
(٣) ڕشت : مكووڕ ، سوور

## (منداڵانی جیهان)

ئـــــەی منـــــداڵانی جیهـــــان
نـــــەوەی داهـــــاتووی ژیـــــان
چـــــینێکی پـــــاك و جـــــوانن
نـــــەوەی ئـــــادەم و حـــــەوان

لـــە ، هـــەر ، كـــوێن ، بـــاش ، بـــزانن
منـــــداڵ ، گـــــشت ، موســـــلمانن
چـــــینێکن ، ســـــپی و بـــــێ گـــــەرد
بـــــێ گونـــــاح و تـــــاوانن

خوشـــــك و بـــــرای یەکدینـــــە
جـــــێ ی ئـــــاواتن ، لـــــەم ، ژینـــــە
ڕابـــــن ، یـــــەکتان ، خۆشـــــبوێ
(خـــوا) یەکـــە و (دیـــن) یـــەك دینـــە

نەتـــــەوە ، زمـــــان و ڕەنـــــگ
ڕەش و ڕووت و ســـپی و شـــەنگ
مـــــرۆڤن ، بـــــێ جـــــودایی
(خـــوا) تـــەقوای کردۆتـــە ســـەنگ

ئـــا .. دەی .. هـــا .. منداڵینـــە
ئایـــا ، ئێـــوە ، حاڵینـــە ؟
گـــرنگ و بنـــچینەنە
مـــژدە و خۆشـــی ماڵینـــە

نووســـینی / شـــەممە ، یەکـــشەممە ، سێـــشەممە/٢٧ ، ٢٨ ، ٣٠/جمادیالاولی/١٤٢٤ ك
٢٦ ، ٢٧ ، ٢٩ / ٧ / ٢٠٠٣ز
تێبینـی / لـە ژمـارە (٢٨)ی بلاوکـراوەی ـ دەنگـی غـەریبان ـ بلاوکرایتەوە

## (قوتابخانەکەم)

قوتابخانەکەم ، قوتابخانەکەم
جێگەی زانست و ماڵە ، جوانەکەم

من ، دەتپارێزم ، گەلێ ، بە ، جوانی
ماڵی زانستی کوڕ و کچانی

لە ، نێو ، پۆل و ژوور ، لە ، گۆڕەپانە
ئاوا ، دەخوێنین ، ئەم ، هەموو ، وانە

وانەی پڕخێری پەروەردەی ئایین
مێژووی هیجرەت و بەرواری زایین

وانەی زانست و زانیاری و علوم
بە ، کەلك و سوودە ، بۆ ، هەموو ، مەردوم

زمانی کوردی بە ، زۆر ، جۆر ، شێواز
ناو و هاوەڵناو جێناو و ئامراز

(پلیـــز)(١) (گـــود) (٢) (ڕیـــده)(٣) وانـــەی ئینگلیـــزی
پـــــەروەردەی باشــــــه ، پـــــاك و تـــــەمیزی

(رجائـــــەن)(٤) (جەییـــــد)(٥) عـــــەرەبی ڕەوان
(تکایـــه) (باشـــه) بـــه ، كـــوردی ، جـــوان

وەرزش ، بـــــۆ ، ســـــوودی ئـــــادەمیزاده
مـــرۆڤ ، بـــه ، گـــشتي بـــه ، گـــەمان ، شـــاده

جوگرافیـــــا ، واتـــــای زەوی ناســـــی یـــــه
مێـــــژووش ، زانـــــستی مرۆڤناســـــی یـــــه

وانـــــەی بیركـــــاری و نیگـــــار و وێنـــــه
تەماشـــــای خـــــۆت ، كـــــه ، لەبـــــەر ، ئاوێنـــــه

هاوڕێیانم

بــــــەڵێ ، لێـــــــرەدا ، قوتابخانەکـــــــەم
مـــــاڵی بەســــــوودی نیـــــــشتیمانەکەم

هیوادەخــــــــوازم ، قوتابخانــــــــە ، بـــــی
جێگـــــەی پـــەروەردەی ئـــەو ، ئینـــسانە ، بـــی

نووسینی / دووشەم/٢٩/ جمادالاول/ ١٤٢٤ ك
٢٨ / ٧ / ٢٠٠٣ز

فەرهەنگۆك :
(١)پلیز : تکایە
(٢)گود : باش
(٣) ڕید : بخوێنە
(٤) رجائەن : تکایە
(٥) جەیید : باشە
تـــێ بـــی نـــی/ لـــەژماە (٦١) ی گۆڤـــاری (بـــاوەگوڕگوڕ)
بڵاوکرایەوە

# (ئەنفال)

ئـــــەنفال ، پـــــیرۆز و جوانـــــە
ســـــورەتێکی نـــــاو ، قورئانـــــە

قورئـــــانیش کـــــەلامی خوایـــــە
وشـــــەکانی پـــــڕ واتایـــــە

وشـــــەکی(١) پـــــاك و بـــــەڕێزە
گـــــرنگ و بـــــەهێز و پێـــــزە

دەســـــتکەوت و غەنیمـــــەی جەنگـــــە
حـــــەلال و ڕەوا و بـــــە ســـــەنگە(٢)

موســـــلمانان ، لێ ی حاڵینـــــە
دەی بـــــزانن ، منداڵینـــــە

هاوڕێیانم

بــــه ، تایــــەتی زارۆی كــــوردان
نــــەوەی چــــاونەترس و مــــەردان

پێویــــسته ، زۆر ، پێویــــستی یــــە
زانیــــاری و پێــــد اویــــستی یــــە

شــــارەزای وشــــەی (ئــــەنفال) بــــن
بــــاش ، تێبگــــەن و خۆشــــحال ، بــــن

نووسینی /یەكشەم ، سێ شەم ، چوارشەم/١٩ ، ٢١ ، ٢٩/جمادی الاخرە/ ١٤٢٤ ك
١٧ ، ١٩ ، ٢٧ / ٨ / ٢٠٠٣ز
فەرهەنگۆك :
١)وشەكی : وشەیەكی
٢)بەسەنگە : بەنرخە

## (دەستخۆشی)

دەستخۆش ، بژی سەرکەوی
هەر ، بە ، چاکە ، دەرکەوی

یارمەتی خەلکی بدەی
بە ، پێ ی ڕێ ی (خوا) کار ، بکەی

کارێکی چاك و خێر ، بوو
خەلکی دیشت ، لێ فێر ، بوو

چونکە ، خەلکێك ، دەیانگووت
خاوێنی ئاکار و خووت

کاریگەری باش ، بووە
خەلك ، تێ ی گەییشتووە

کەواتــــــە ، بـــــەردەوام ، بـــە
ئـــەوها ، بـــە ، هـــۆش و فـــام ، بـــە

چــــاکە و باشــــــە ، بنوێنــــــە
دەستخۆشـــــی بـــــە دەســـــت بێنــــە

نووسینی /پێنجشەم ، هەینی / ١٢ ، ١٣ /محرم/ ١٤٢٥ ك
٣ ، ٥ / ٣ / ٢٠٠٤ل

## (ڕاوێژپێککردن)

بە ، شورا(١) و بە ، ڕاوێژە
کاتێك ، دەست ، بە دەسنوێژە

هەنگاوی چاك و بەسوود
بە ، هێز و پوخت و نموود(٢)

بۆ ، گشت ، ئاستەنگ و کێشە
کە ، پڕ ، ناخۆشی و ئێشە

چارەسەری تەواوە
ڕێك و پێك و گونجاوە

بەڵێ ، لێرە ، دەمەوێ
چونکە ، زارۆم ، (٣) خۆشدەوێ

پێتان ، دەڵێم ، پاکەکان
جەرگەکانی داکەکان(٤)

بـــــزانن ، كـــــه ، ڕاوێـــــژه
بـــــۆ ، كێـــــشه‌كان ، ســـــاڕێژه

ڕاوێـــــژیش ، لـــــه‌م ، ئیـــــسلامه
فه‌رمانێكـــــه و په‌یامـــــه

چـــــاكه ، ڕاوێـــــژ ، پێككـــــردن
بـــــه ، وردی هـــــه‌نگاو ، بـــــردن

نووسینی / چوارشه‌م / ٢٠ / ذی الحجة / ١٤٢٤ ك
١١ / ٢ / ٢٠٠٤ل

فه‌رهه‌نگۆك :
١)شورا : ڕاوێژ
٢)نموود : نرخ ، قیمه‌ت ، پێز
٣)زارۆم : منداڵم
٤)داكه‌كان : دایكه‌كان

## (مێژوو)

مێـــژوو ، واتـــه ، لـــه ، مێـــژه
زانـــینی بـــاش و چـــێژه(١)

ڕووداووبەســـــــــــــەرهاته
دڵخۆشـــــی ومەرگەســـــاته

زانیـــــاری یەکـــــه ، پێویـــــسته
وانەوپەندوزانـــــــــــــــسته

لەبـــــەروه(٢) ، منداڵینـــــه
برالەوهەڤاڵینـــــــــــــه

لـــه ، مێـــژوو ، شـــارەزا ، بـــن
تێکۆشـــەر و ئـــازا ، بـــن

چـــونکه ، ئاشـــکراو ڕوونـــه
پـــەڕی نـــوێ ی مێژوونـــه

جـــــا ، پێتـــــان ، ڕادەگـــەینم
ئـــــەم ، واتایانـــــە ، دەیـــنم

مێـــــژوو(تـــەئریخ)هیـــستۆری(٣))
بـــــە ، دادگـــــەری وبـــــە ، زۆری

لـــــــەدونیادا ، ڕوویـــــــداوە
ئێـــــستاش ، وا ، هەیـــــە ومـــاوە

واتـــــە ، مێـــــژوو ، ڕاســـتی یـــە
زانـــــــینی پێویـــــــستی یـــــە

نووسینی/یەکەشەم/١١/رجب/١٤٢٤.ك
٢٠٠٣/٩/٧ل

فەرهەنگۆك:

١)چێژە:تام وخۆشی خۆی هەیە
٢)لەبەروە:لەبەرئەوە
٣)هیستۆری:مێژوو ، تەئریخ

# (مەلەکردن)

ئەوەی مەلە , بزانێ
ماوەی هەبێ و بتوانێ

جا, دەزانێ, چەند , خۆشە
لاشەو دڵی پێخۆشە

لەش , چوست و چالاك , دەكات
هێزو بەرگەی پێ دەدات

كاتێكی بە , سودو جوان
دەباتە , سەر , لە , ژیان

لەنێو ئاو مەلە دەكا
ناخنكێ و بەو بەردەگا

هاورێیانم

پــــیّ ی دەڵـــــێن , مەلـــــەوانی
دلێـــــــــــر و پاڵـــــــــــەوانی

ئـــــای منـــــدالآن , هـــــەمووتان
وەك , ڕەوشــــــتێك و خووتــــــان

داوا , لـــــه , دابـــــاب , بکـــــەن
لـــــه , بـــــوّ , مەلـــــەتان , ببـــــەن

چـــــونکه , مەلـــــه , فێربوونـــــه
بـــــه (ســـــوننەت) پابەنـــــد بوونـــــه

نوسینی/پێنج شەم/ ١٥ / رجب / ١٤٢٤ .ك
١١ / ٩ / ٢٠٠٣.ل

# (تووڕە مەبن)

نا ..نا..نا.. منداڵینە
خۆشەویستیماڵینە

نەکەن ، نەکەن ، زویر ، بن
باشە ، عاقڵ و ژیر ، بن

پێ لەقە ، مەوەشێنن
ئەگەر ، ئازا و بەتێنن

خۆ ، مرۆڤ ، تووڕە ، دەبێ
وتە و قسەکیش ، دەڵێ

بەڵام ، دەبێ ، بڕوانن
کەئێوە ، موسڵمانن

موسڵمانیش ، دیارە
شارەزایە و هۆشیارە

لــــه ، خـــۆڕا ، تـــووڕه ، نـــابێ
مه‌گـــه‌ر ، تـــه‌نها ، بـــۆ (خـــوا) بـــێ

چـــونكه ، بـــه ، تـــووڕه بوونـــه
بـــێ ئـــارامی و هه‌ڵـــچوونه

نێـــوان ، مـــرۆڤ ، تێـــك ده‌چـــێ
بـــۆ ، نێـــو ، ڕه‌وشـــی نابـــه‌جێ

كه‌واتـــه ، تـــووڕه ، مـــه‌بن
تـــا ، تووشـــی هه‌ڵـــه ، نـــه‌بن

نووسینی /پێنجشه‌م /٢٥/رمضان/١٤٢٤.ك
٢٠/١١/٢٠٠٣ز

## (درۆ)

موســــلمان ، درۆ ، ناكـــــات
لــه ، گوتــه و كــار ، ڕاســت ، دەكـات

لــــــه ، ژيـــــانى ڕاســــتگۆيه
خـــــاوەن ، هەڵوێـــستى خۆيـــــه

ڕاســــــــتەقينه ، دەبێــــــژێ
هـــــــەرگيز ، درۆ ، نابێـــــژێ

چـــــونكه ، خــــــاوەن ، ڕێبـــــەره
شـــــوێنكەوتەى پێغەمبـــــەره (ﷺ)

بـــــــەڵێ ، كەواتــــــــه ، زارۆ
ئێــــــوەش ، دووربــــــن لــــــه ، درۆ

ڕێ ى پێغەمبــــەر ، (ﷺ)پــەيڕەو ، كــەن
بــــه ، ڕاســـتى و مافتــــان ، دەگــەن

نووسينى / شەوى سێ شەم ٢٨/٢٩ /شەوال/ ١٤٢٤ ك
٢٢ / ٢٣ / ١٢/٢٠٠٣ز

# (مافی چاکە)

سوپاســـتان ، دەکـــەم ، ئـــەی منداڵـــەکان
بـــرا و خوشـــکەکان ، ئـــەی هەڤاڵـــەکان

چـونکە ، چـاکەتان ، لەگـەڵ ، مـن ، نوانـد
بــە ، وشــەی جــوان ، ئــەمنتان ، دوانـد

بــــەڵێ ، دەزانم ، پاداشـــتی چـــاکە
دەبــێ ، چـاکە ، بـێ ، ئـەی خوشـکەوکاکە

منـیش ، لــە ، ڕاسـتخۆم ، (١) وەکومنـداڵێ
بـــە ، ئامۆژگـــاری و ڕێنمـــای(٢) مـــاڵێ

لــە ، لایــەن ، دابــاب (٣) ، واگۆشــکراوم
بــە ، جــوانی و پــوختی ڕێــز ، لێنــدراوم

لــه ، بــەر ، ئــەم ، هۆیــه ، چــاکه ، دەخــوازم
بــــه ، ســــوپاس ، کــــردن زۆر ، ســــەرفیرازم

نووسینی/یەکشەم/٥ ، ١٢/ذی القعدة / ١٤٢٤ ك
٢٨ /١٢ / ٢٠٠٣ل
٤ / ١ / ٢٠٠٤ل
فەرنگۆك :
(١) لەڕاستخۆم : له ئاستخۆم
(٢)ڕێنما ، ڕێنوێنی
(٣) داباب : دایك و باوك

# (سوننەت)

(سوننەت) واتە ، ڕێبازە
ڕێ ی ئازادی و دەربازە

ڕێبازی پێغەمبەرە (ﷺ)
هەر ، بۆ چاکە ، هاندەرە

خاوێن وڕەند و ڕوونە
چاکی لاشە و دەروونە

ڕێگەی دروستی ژینە
یادی دونیا و ڤەژینە(١)

بە ، پێ ی فەرمانی(خوایە)
لە ، سروش(٢) ونیگایە

ڕێ ی ژیانی ئینسانە
ژیان ، پێیەوە ، ژیانە

هاوڕێیانم

موسـلمان ، پـێ ی پابەنـدە
ڕەزامەنـدی (خواوەنـدە)

ئـا ، بـەڵێ ، ڕێ ی (سـوننەتە)
بـۆ ، گـشت ، مـرۆڤ ، نیعمەتـە

کەواتـە ، بـا ، منـداڵان
لـە ، گـشت ، جێگـە و گـشت ، مـاڵان

پـەیڕەوی سـوننەت ، بکـەین
تـا ، بـە ، سـەربەرزی ، بگـەین

نووسینی / پێنجشەم ، هەینی/ ٢٣ ، ٢٤/ذی القعدة / ١٤٢٤ ك
١٥ ، ١٦ / ١ / ٢٠٠٤ل

فەرهەنگۆك :
(١)ڤەژین : ڕۆژی دوایی ، ژیانەوە
(٢)سروش :نیگا ، وەحی

## (تەماشاکردن)

هەیدۆ ، سەربەستی ، هێ..هێ
من وتۆوئەو ، ئەوێهێ

کاتێک ، بەو ، کۆنترۆڵە
ژن و پیاوو زارۆڵە

لەم ، کەناڵ ، بۆ ، ئەو ، کەناڵ
ڕەوش وحالی زۆربەی ماڵ

سەرمان ، پێیەوە ، قاڵە
هەرایەو گاڵە ، گاڵە

بەلام ، من ، دەڵێم ، لێرە
ئەوەی وریاودلێرە

سەیری شتی باش ، دەکات
تێدەفەکرێ وتێدەگات

## هاورێیانم

کەواتـــــــه ، تەلـــــــەفزیۆن
(صـــەحن)و(دی ڤـــی دی)و(ڤیـــد یـــۆن)

ئـــــامێرن ، چـــــۆنت ، بـــــوێن
ئـــــەوها ، لەگـــــەڵت ، دەدوێـــــن

دەوجـــــا ، ئێـــــوەش ، منـــــدالآن
زینـــــەت وخۆشـــــی مـــــالآن

تەماشـــــای شـــــتی چـــــاك ، کـــــەن
ڕوو ، لـــــه ، ئاڕاســـــتەی پـــــاك ، کـــــەن

شـــــتی چـــــاکیش ، بـــــزانن
هاوتـــــــەریبی (١) قورئـــــــانن

نوسینی/ یەکشەم/٢٦ /ذی‌القعدة /١٤٢٤ ك
١٨ / ١ / ٢٠٠٤ ل

فەرهەنگۆك :

(١) هاوتەریب : هاوڕێك ، گونجاو

# (بەهەشت)

(بەهەشـــــت)پاداشـــــتی (خوایـــــە)
بـــــۆ ، ئـــــەوەی بـــــە ، بڕوایـــــە

خـــاوەن ، هەشـــت ، دەرکـــەی(١) ڕێـــزە
بـــــۆ ، ئـــــەوەی خۆپـــــارێزە

(بەهەشـــــت) بـــــاخ و باخاتـــــە
بـــــۆ ، موســـــلمان ، خەڵاتـــــە

ســـــەد ، پایـــــە و پلـــــەدارە
خـــــاوەن ، دار و تـــــەلارە

جـــــێ ی خۆشـــــی و ڕابواردنـــــە
پاداشـــــتی کارکردنـــــە

بـــــەڵێ ، پێویـــــستە ، پێویـــــست
بـــــۆ ، مرۆڤـــــی خـــــودا ویـــــست

دان ، بـــه ، حەقیقـــەت ، دانـــێ
واتـــــای مـــــرۆڤ ، بزانـــــێ

کەواتـــــــه ، تێکۆشـــــــانه
بگـــەی بـــه و ، بەهەشـــتانه

جـــا ، حـــەز ، دەکـــەم ، منـــدالاّن
پـــاك و وریـــا و عـــاقلان

بـــۆ ، بەهەشـــت ، تێبکۆشـــن
تـــاکو ، چـــێژی بنۆشـــن

نووسینی /دووشەم ، شەوی سێ شەم/سێ شەم ،
/۲۷- ۲۸/ذي القعدة /۱٤۲٤ .ك
۱۹-۲۰ /۱/ ۲۰۰٤ .

## (هەینی)

(جومعە)بەڕێزی ڕۆژانە
حەفتەمین ، ڕۆژی حەفتانە

لای موسلمانان ، بەڕێزە
جێگەی بەهاوشادی وهێزە

کاتی نیوەڕۆی(خوطبە)یە
فەرزەوخێری زۆری هەیە

بە ، کوردی هەینی پێ دەڵێن
دوانگەی پەیمانەوبەڵێن

مرۆڤ ، ئامۆژگاری ، دەکات
ورەومتمانەی پێ دەدات

لە ، ڕیزدا ، ڕێک ، ڕاوەستانە
بێ ورتە ورت وهەستانە

سەرەتاو کۆتایی ژینە(١)
ڕۆژێکی پیرۆزی دینە

جا ، لە ، ڕاستی منداڵینە
جگەر گۆشانیماڵینە

وشەی(جومعە)(جوموعەیە)
موسلمان ، بۆی ئالوودەیە(٢)

نووسینی/شەمو ، چوارشەم ، پێنجشەم/٢ ، ٦ ، ٧/ذي الحجه/١٤٢٤.ك
٢٤ ، ٢٨ ، ٢٩/١/٢٠٠٤ل

فەرهەنگۆك:
(١)واتەدونیاڕۆژی جوموعە دروست کراوەو تێك دەچێ
(٢)ئالوودە:عەودالْ
تێبینی/ لەژمارە (٤٤)ی گۆڤاری نوالەی نوێ بلاوکرایتەوە

# (جەژنی قوربان)

جەژنـــــە و جێژنـــــەی قوربانـــــە
جـــــــــەژنی قوربانیدانـــــــــە

یــــــادێکی شـــــانازی یــــــە
مایـــــەی ســــــەرفیرازی یــــــە

ڕۆژێکــــــــــی زۆر ، پــــــــیرۆزە
ئـــــــی مرۆڤــــــی دڵــــــسۆزە

(دەی ذیلحیجحجــەی)هــەموو ، ســـاڵ
ئـــــافرەت و پیــــــاو ومنــــــداڵ

کامــــــــەران و دڵخۆشــــــــن
بـــــەرگی جــــوان ، دەپۆشـــــن

پـــاش ، نوێـــژی جەژنـــە ، هـــەموو
بـــە ، خۆشەویـــستیو فـــەرموو

پیرۆزبـــایی ، لێـــك ، دەكـــەن
لـــە ، واتـــای جـــەژن ، دەگـــەن

بـــەڵێ ، جـــەژنی ئەزموونـــە
لای موســـلمانان ، ڕوونـــە

ئـــەرمونی (ئیبراهیمـــە)
بردنـــەوەكی (عـــەظیمـــة)

ئیـــسماعیل و هاجـــەر ، خـــان
گوێڕایـــەڵ ، بـــوون ، زۆر ، جـــوان

بــــــەڵێ ، منــــــدالآن ، وايــــــە
جـــــەژن ، پاداشـــــتى (خوايــــــە)

جــــــەژنى قوربــــــان خەڵاتـــــــە
خۆشــــــى گــــــەل و وڵاتــــــە

نووسينى
شەوى سێ شەم /٣ـ٤ /ذى الحجە /١٤٢٤ ك
٢٥ـ٢٦/ ١ /٢٠٠٤ل
فەرهەنكۆك :
(١)(عظيمة) : گەورەيە

# (جلكی كوردی)

جلكـــی كـــوردی جوانـــه
ئـــی میللـــەتی كوردانـــه

جۆرەهـــا و ڕەنگاوڕەنگـــه
ڕێـــك و پێـــك و قەشـــەنگە

شـــاڵ و ڕانـــك و چـــۆغەڵە
پشتێنیـــــشی لەگەڵـــه

كراســـی كـــوردی باخەڵـــه
ئـــی ئـــافرەتی زیتەڵـــه

كـــــلاو و جەمـــــەدانی
كورتـــــەكی مرادخـــــانی

كـــەوێ و ســـوخمە و ئێلەگـــه
بـــۆ ، ئافرەتـــان ، شمەكـــه

جــــۆر و نــــاوی دیـــش ، هەیـــە
ڕێـــــك و جـــوان و پۆشــــتەیە

ئـــــا ، منــــدالأنی کـــــوردان
نـــــەوەی ڕەســــەن و مــــەردان

جلکــــــی کــــوردی نــــەژادە
کـــــوردی پـــــیّ ڕێـــك و شـــادە

داپۆشــــــــەر و حیجابـــــــە
ڕێـــــك و بـــــاش و نایـــــا بـــــە

ئـــــەجا ، ئێــــوەش ، بپۆشـــــن
خۆتـــــانی پـــــیّ داپۆشـــــن

نووسینی /هەینی ، شەموو ، یەکشەم/
١٥ ، ١٦ ، ٢٤/ذی‌الحجة/١٤٢٤ك
٦ ، ٧ ، ١٥/٢/ ٢٠٠٤ل

# (هەوڵدان)

خۆشم ، دەوێ ی (ئای لەڤ یو)
جانە ، ڕەنگ و ناڤێت ، تو

دەمەوێ (ئوریـد) (ئای وەنت)
بۆ ، تۆ ، سەرکەوتن و ڕەند

دەڵێم (ئەقول) و (ئای وسێ ی)
تۆ ، بۆ ، کاری چاکە ، بێ ی

بەڵێ(ئەجەل ، نەعم)(یێس)
بۆ ، تۆی بەڕێز و بە ، پێز

لێرە(مین هونا) (ناوهێر)
پێت دەڵێم ، بە ، زمانی خێر

هاورێیانم

برام(ئەخی)(مای برازەر)
خوشکم(ئوختی)(مای سیستەر)

ئێوەی مندالّ، هەولّدەن
گوێڕایەلّ، بن، پێبگەن

لە، ژین، بۆ(خوا) بگونجێن
بە، دەستی خێر وخاوێن

نووسینی/شەموو/١٦/ذی الحجة / ١٤٢٤ ك
٧ / ٢ / ٢٠٠٤ل
تـی بـی نـی/ لـەژمارە (١٤٨) ی گۆڤاری جگەر گۆشەکان- بلاّوکرایەتەوە

# (پاداشت)

منداڵان وزارۆڵان
چالاك تونودتۆڵان

ئا ، پاداشت وخەڵاتە
بەری(١)ڕەنج وخەباتە

واتە ، گەر ، سەیر ، بکەین
سەرنجی ورد ، ورد ، بدەین

قوتابی کە ، دەخوێنێ
پاداشتێك بەدەست دێنێ

وەرزشوان ، دەباتەوە
خەڵات ، کۆدەکاتەوە

بەڵام ، باشترین ، خەلات
پشت ، بە(خوا)ی ، بە ، دەسەڵات

ئـــــی(خـــــودا)ی کاربـــــەجیٚ یـــــە
ڕاســـــــتەقینە ولـــــــەجیٚ یـــــــە

پاداشـــــــتی(خـــــوا)ش بەهەشـــــــتە
ئـــــــــارامی دڵ وهەســـــــــتە

بـــــۆ ، ئـــــەو ، کەســـــەی لـــــە ، دونیـــــا
بکۆشـــــــیٚ ، لـــــــە ، پیٚناویـــــــا(٢)

نووسینی/پیٚنجشەم/٢١/ذي الحجه/١٤٢٤.ك
١٢/٢/٢٠٠٤.ل

فەرهەنگۆك:

(١)بەری:بەرهەمی
(٢)لەپیٚناویا ، لەپیٚناوخوا

تیٚبینی/لەژمارە(٢٨)ی گۆڤاری — خەندە بلاٚوکرایتەوە

## (ئەی منداڵان)

منداڵان ، ئەی منداڵان
خۆشی و زینەتین ، ماڵان

حەزدەکەم ، گوێم ، بدەنێ
تێهبگەن(١) و بهگەنێ (٢)

بگەنە ، ڕاستی مێژوو
جان جان (٣)و بی ئاڤەژوو(٤)

خودی خۆتان بناسن
بنەچەن(٥) ، نەکێماسن(٦)

نەوەی بابە ، ئادەمن
جهیٚ(٧) ، هیڤیا(٨) ، سەردەمن

بـــــه ، نــــــەژاد ، موســــــلمانن
ئەڤــــــه ، ڕاســــــته ، بـــــزانن

بەخشــــــــشی (خوداوەنــــــدن)
جــــان و پاقـــــژ(٩) و ڕەنــــدن(١٠)

منـــــــــدالآن ، مندالّینـــــــــه
خوشـــــتڤیێن ، نـــــاڤ ، مالینـــــه

بـــــزانن ، ئیـــــسلام ، ڕێ یـــــه
تـــــەنێ ، دینـــــا (خـــــودێ یـــــه)

نووسینی /دوشەم ، سێ شەم ، شەوی چوارشەم ، شەوی هەینی/٢ ، ٣ ، ٤/٣ ، ٦/٥ /محرم /١٤٢٥ .ك
٢٣ ، ٢٤ ، ٢٥/٢٤ ,٢٦/٢٧/٢ / ٢٠٠٤ز

تێبینی /لەژمارە (١١)ی گۆڤاری (خەندە) بلاوکرایتەوە

**فەرهەنگۆك :**

١)تێهبگەن : تێبگەن

٢)بهگەنێ : بگەنێ

٣)جان جان : جوان جوان

٤)بێ ئاڤەژوو: بێ ئاوەژوو ، بێ پێچ و پەنا

٥) بنەچەن : بنچینەن

٦)نەکێماسن : کم نین ، لەکەدارنین

٧)جهێ : جێ ی

٨)هیڤیا : هیوای

٩)پاڤر : پاك

١٠) ڕەندن :باش و چاکن

## (سوپاس)

سوپاس و سوپاسگوزاری
بەرامبەر ، گشت ، چاکەکاری

هەستکردن و پێزانینە
هۆشیار بوون و لێزانینە

بڵاوبوونەوەی شادی یە
خووی چاکی ئادەمزادی یە

کەواتە ، زارۆ و منداڵان
لە ، گشت ، جێگە و ماڵ و کۆڵان

سوپاسی چاکەکار ، بکەن
کە ، چاکەتان ، لەگەڵ ، دەکەن

چــــونکه ، فــــەرموودەی پــــیرۆزە
مایــــەی خۆشــــی و ڕەحــــم و ســـۆزە

پێمــــــان ، دەفـــــەرموێ ، سوپاســـــە
گـــــەر (مــــەن لـــــەم یەشکورینناســــــە)

لەگــــەڵ ، یــــەكتر ، پـــەیڕەو ، نەكـــەن
ئـــەوا ، سوپاســـــی (خـــوا)ش ناكـــەن

نووسیی /سێ شەم /چوار شەم /پێنج شەم /١٠ ، ١١ ، ١٢ ، /محرم/ ١٤٢٥ ك
٢ ، ٣ ، ٤ ، /٣ /٢٠٠٤ل

فەرهەنگۆك :
(١) بەشێكە لەفەرموودەی (من لم یشكر ـ الناس لم یشكر الله)

## (ئاساییش)

بە ، ئارامی و ئاساییشە
بە ، کردەوە و نمایشە

دڵ و وڵاتی ئادەمزاد(١)
ئارام ، دەبێ و دەبێتن شاد

ئاساییش ، واتە ، بێ ترسی
نەك ، تۆقان و نەك ، وەڕسی

چونکە ، بە ، ڕاستی ئاساییش
بەهێزبوونە ، بۆ ، تەباییش

پاراستنی ئازادی یە
مایەی دڵخۆشی و شادی یە

بەڵێ ، ئەنجا ، منداڵەکان

هاورێیانم

جێگـــــەی ئومێـــــدی ماڵـــــەکان

تــــەنها ، ئیــسلامە ، دینـــی(خـــوا)
بایــــــەخ ، بــــــە ، ئاســــاییش دەدا

ئاسایــــــــــشی بوونــــــــــەوەرە
شـــــــادمانی و دڵخۆشــــــکەرە

بـــا..جـــا..هـــەموو ، ئاســـاییش ، بـــین
جـــــوانترین ، نمـــاییش ، بـــــین

نووسینی/یەکشەم/٢٢/محرم/١٤٢٥ .ك
١٤ / ٣/ ٢٠٠٤ ل

فەرهەنگۆك :

(١) ئادەمزاد : ئادەمی ، ئادەمیزاد

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

## ناوەرۆك

## هاوڕێیانم

هاوڕێیانم